# ئیتر ئەوە جەنگە

## چیرۆکی لاوە ئازاکانی هەڵەبجە

کلاوس کۆردۆن

لە ئەڵمانییەوە: عەبدولغەنی کاکۆ

# ئیتر ئەوە جەنگە

## چیرۆکی لاوە ئازاکانی هەڵەبجە


کلاوس کۆردۆن

لە ئەڵمانییەوە: عەبدولغەنی کاکۆ

چیرۆک

کلاوس کۆردۆن

# ئیتر ئەوە جەنگە

عەبدولفەنی کاکۆ

ناوی کتێب | ئیتر ئەوە جەنگە
نووسەر | کلاوس کۆردۆن
وەرگێڕان لە ئەڵمانییەوە| عەبدولغەنی کاکۆ
دیزاینی بەرگ و تێکست | کەیوان قادری
وێنەکان| حەمە هاشم
چاپ | یەکەم 2023
چاپخانەی کارۆ /سلێمانی
تیراژ |500 دانە
نرخ| 2000 دینار

لە سەر ئەرکی بەڕێز ئازاد تۆفیق پارێزگاری هەڵەبجە چاپکراوە



لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارەی (١٥٩٨)ی ساڵی (٢٠٢٣) پێدراوە.

**سەرنجێکی پێویست**

نووسەری ئەم چیرۆکە ناوی کلاوس کۆردۆنە.
کلاوس کۆردۆن ڕۆماننووسێکی بەناوبانگی ئەڵمانییە، ساڵی ١٩٤٣ هاتۆتە دونیاوە. چەندین ڕۆمان و کۆمەڵە چیرۆکی بڵاوکردۆتەوە کە ژمارەیان لە ٩٠ کتێب تێدەپەڕێ. زۆر بایەخی بە ڕۆمان و چیرۆکی لاوان داوە، زۆر شتی بۆ منداڵانیش نووسیوە بۆیە لای نەوەی نوێی ئەڵمانی زۆر ناسراوە.
کلاوس کۆردۆن لەو چیرۆکەدا لە کۆمەڵێک منداڵ و لاوی هەڵەبجە دەدوێ، کە لە کۆڕەوەکەی ساڵی ١٩٩١دا تووشی چ دەردەسەرییەک دەبن و چەند قارەمانانە ڕووبەڕووی ئاستەنگەکان دەبنەوە. لەو چیرۆکەدا کارەساتی هەڵەبجە بە کۆڕەوەکەوە گرێ دەدەات.
ئەوەی جێگەی سەرنجە، نووسەر (وەک لە خۆییم

بیست) هەتا بڵاوکردنەوەی ئەم چیرۆکەو دواتریش، هەرگیز کوردستانی نەبینیوە، لەگەڵ ئەوەشدا نەهامەتییەکانی خەڵکی کوردستان بەهۆی ڕژێمی لەناوچووی سەددامەوە بەشێوەیەکی واقیعی لەم چیرۆکەدا بەرجەستە کردووە. لەسەرەتای نۆهەتەکانی سەدەی ڕابردوو، لەوکاتەی کارەساتی هەڵەبجە و مەینەتییەکانی کۆڕەوە ملیۆنییەکەی خەڵکی کوردستان بووبوونە گەورەترین بابەتی میدیاکانی دونیا، ئەو هەواڵانەی ئەوکاتە بوونەتە سەرچاوەیەکی سەرەکی بۆ نووسینی ئەم چیرۆکە، دیارە هەر هەڵەیەک لەناو ئەم چیرۆکەدا هەستی پێ بکرێ سەرچاوەکەی لە هەڵەی تێڕوانینی میدیاکانی ئەوکاتەوە سەرچاوەی گرتووە. یەکێک لەو تێڕوانینە هەلانەی لەو کاتەدا دەبیسترا ئەوەبوو کە خەڵکی هەڵەبجە بەهۆی لایەنگرییان بۆ ئێران لەشەڕەکەدا کەوتبنە بەر ئەو هێرشە دڕندانەیە. کە ئەوە تێڕوانینێکی زۆر هەڵەیە و خەڵکی ئاشیتخوازی ئەو شارە هەرگیز نەبوونەتە تەرەف لە شەڕێکی ئاواماڵوێرانکەردا، بەڵام ئەو ڕاستییەش هەیە کە سەددام بەردەوام هێرشی دڕندانەی بۆسەر خەڵکی ئازادیخوازی کورد دەکرد، هەموو کەسێک لە دڵەوە ئەوەی پێخۆش بوو کە ئەو دوژمنە بکەوێتە بەر زەبری دوژمنەکەی خۆی، بەڵام ئایا دەکرێ لە بەرامبەر هەستێکی وادا لەڕێگەی تاوانێکی ئەوها قێزەوندا تۆڵە لەخەڵکی بێتاوان

بکرێتەوە؟ ئەو تاوانە هێندە گەورەیە کە هەتا دونیا ماوە لەمێژووی مرۆڤایەتیدا جێگەی شەرمەزارییە. هەر بۆیە من خۆم لەو ڕستەیەی کە لەژێر کاریگەری تێروانینە نادروستەکانی ئەو کاتەدا پەڕیونەتە ناو چیرۆکەکە بوارد. چونکە من لە تێروانینی مرۆڤدۆستانەی نووسەردا دڵنیابووم و زانیم ئەو بە نیازی دەربڕینی هاوخەمی لەبەرامبەر نەهامەتییە سەختەکانی خەڵکی کوردستان ئەم چیرۆکەی نووسیوە. گرنگترین شتی ناو ئەم چیرۆکە بەلای من هەر ئەوەنییە کە چۆن ئاماژەی بە کارەساتەکانی هەڵەبجەو کۆچڕەوەکە داوە، بەڵکو گرنگییەکە ئەوەیە کە نووسەر هاتووە ماهییەتی ئاشتیخوازانەی مرۆڤی کورد نیشان دەدات ئەوە دەخاتە ڕوو کە مرۆڤی کورد هەرگیز شەڕخواز نەبووە بەڵکو لەپێناوی مافی ڕەوای خۆی بۆ سەربەخۆیی شەڕی بەسەردا سەپێندراوە. هەر ئەم خاڵەش بوو وای لێکردم چیرۆکەکە وەربگێڕمە سەر زمانی کوردی. لە وەرگێڕانەکەشدا هەوڵم داوە خۆم لە وەرگێڕانی وشە بە وشە بپارێزم و بە چەشنێک دایبڕێژمەوە کە لەگەڵ زمانی ئاخاوتنی کوردییدا بگونجێت.

نووسەر لە کۆتایی ئەم چیرۆکەدا ڕوونکردنەوەیەکی دەربارەی مێژووی ئەو ڕووداوە بۆ خوێنەران بڵاو کردۆتەوە، تا بە ئاسانی بتوانن لە چیرۆکەکە بگەن، منیش حەز دەکەم وەک خۆی لە کۆتایی چیرۆکەکەوە

پێشکەشی خوێنەرانی بەڕێزی بکەم. لێرەشدا سوپاسی تایبەتیم هەیە بۆ هونەرمەندی شێوەکار مامۆستا حەمە هاشم، کە بەو هێلکارییە جوانانەی ناوەرۆکی چیرۆکەکەی ڕۆشنتر کردەوە.

**عەبدولغەنی کاکۆ**

**ئەڵمانیا**

# ئیتر ئەوە جەنگە

## چیرۆکی لاوە ئازاکانی هەڵەبجە

لەپشت گردەکەی سەر ئەو ڕێگایە، خۆیان حەشار داوە، کە بۆناو شاخ و داخەکان دەڕوات. چاویان بڕیوەتە ئەو ئاراستەیەی کە دەبێ زیلەکەی لێوە بێ.

جەبار سوێندی بۆ خواردوون، کە هەموو ڕۆژێک لەو کاتانەدا زیلەکە بیرەدا تێدەپەڕێ. ئێستاکە تەنیا دەبێ بەخت یاوەریان بێ.

ئەحمەد لە بێزارییان دەستی خۆی گرمۆڵە دەکات. ڕۆژێکی زۆر وشک و گەرمە. هەوا لەو گەرمی نیوەڕۆیەدا داخ بووە. ئەوان تەنیا ئەو

کاتـەدا زیلەکـە دەناسـنەوە کـە لێیانـەوە نزیـک ببێتـەوە.

حەسـەنی بچکۆڵـە بـە ئەسـپایی سـیخورمەیەک لـە ئەحمـەد دەدا «دەبـێ بەهـرە نەترسـێ؟»

ئەحمـەد سـەیری بەهـرەی بچکۆڵـە دەکات، کـە لەخـوارەوە خـۆی خسـتۆتە سـەر ڕێگاکـە، دەسـتەکانی لەخـۆی دوور خسـتوونەتەوە وەک ئـەوەی بیـەوێ بیانگەیەنێتـە چەنـد بەردێکـی سـەر ڕێگاکـە کـە لـەلای ڕاسـت و چەپییـەوە کەوتـوون. سـەری بـە جۆرێـک خسـتۆتە سـەر چـەوی ڕێگاکـە کـە ڕووی لـە شـاخەکانەوە بێـت.

بەهەرە تەنیا ئەوکاتە هەستی بە هاتنی زیلەکە دەکرد، کە دەنگی ببیستی. ئەوەش بە مەبەست بوو. ئەم نەیدەویست بە هۆی چاوترووکاندنەکانییەوە کارەکە لە خۆی تێک بدات.

هەرکاتێ زیلەکە بێت و لای بوەستێ، ئەوا سەربازەکان تەنیا پشتی سەری دەبینن.

ئەحمەد لەو باوەڕەدابوو کە بەهەرە دەترسێ. تەنیا ئەوانەی دەترسن، دەتوانن ئازا بن.

«ئەوە چیە؟» جەبار هەستی کرد ئەحمەد بەشێوەیەکی کتوپڕ دەلەرزی

«ئەوە چییە دەڵێی لەبیرت چووە؟»

نەخێر ئەحمەد هەرگیز لەبیری نەچووە. ئەم هەموو کاتێک ئەو وێنەیەی هەڵەبجەی دێتەوە بەر چاو، کە بەر لەسێ ساڵ لەکاتی گەڕانەوەی بۆ هەڵەبجە بینیبووی.

مام عەبدول ئەمی ئاگادار کردبووەوە کە کاری وانەکات. ئەم تازە دوانزە ساڵان بوو، هێشتاکە زۆر بچووک بوو، هی ئەوە نەبوو شارەکەی بە کاولکراوی ببینێ.

بەر لەهەموو شتێ دەبووایە چیرۆکی خەڵکە
رزگار بووەکە بەبیر خۆی بێنێتەوە کە
بەسەرهاتی زۆر ناخۆش بوون. سەرەڕای
ئەوانەش ئەحمەد گەڕایەوە شارەکە. سێ
ڕۆژان بە پێ ڕۆیشت، چاوی بەو ڕێگا خاپوور
کراوانە کەوت کە ئەم چەند رۆژێک پێشتر
بەسەریاندا دەڕۆیی بۆ قوتابخانە، یان بەو
ڕێگایانەوە سەردانی هاوڕێکانی دەکرد. هەر
لە هەمان کاتدا چاوی بەو بڵدۆزەرانە کەوت
کەشارێکی ئاوەدانییان وا لێ دەکرد وەک ئەوەی
بەر بوومەلەرزە کەوتبێ، هەتا دەهات لەناخی

خۆیدا سارد دەبووەوە.

«لەبەرچی؟»

بەردەوام تەنیا لەخۆی دەپرسیەوە:

« لەبەر چی؟»

بەڵام مام عەبدول ڕاستی دەکرد. بەڵێ ئەوانەی ڕزگاریان ببو ناخۆشترین شتیان دەگێڕایەوە:

ئەو خەڵکە بەبێ ئەوەی پێشتر ئاگادار بکرێنەوە، بەشێوەیەکی کتوپڕ شارە بچکۆلەکەیان بە چەکی کیمیایی بۆردومان کرا. پێنج هەزار مرۆڤ بە گازی ژەهراوی لەناوچوون، ژمارەیەکی زۆر لەوانە منداڵ بوون. زۆر لە دایک و باوکەکان خۆیان بەسەر منداڵەکانیان دادەدا تا جەستەیان لەو ژەهرە بپارێزن، بەڵام ئەوانیش لەگەڵ منداڵەکانیان بەیەکەوە دەمردن.

ئەحمەد دەیزانی، کە ماڵەوەیان ڕزگاریان نەبووە، بەڵام نەیدەتوانی هەر وا بە ئاسانی بڕوا بکات، هەرچەندە مام عەبدول ئەو کات ئەو هەواڵەی پێ گوتبوو، بەڵام نەیدەتوانی بڕوا بکات کەوا دایک و باوکی، خوشک و براکانی، داپیرەو باپیرەی هەر هەموویان لەناوچوون.

«هیچ یەکێک لەوان نەماون؟ ئەوە شتێکە جێگەی بڕواپێکردن نییە. شتێکە هێندە شێتانە دێتە بەرچاو، وەک ئەوەی مرۆڤ بێنێتە پێکە نین! »

هەڵبەتە ئەم پێنەدەکەنی چونکە دەیزانی هەواڵەکە ڕاستە. بەڵام ئەم جارێ ئەو ڕاستییەی بەلاوە نابوو، جارێ نەیدەویست بڕوا بکات.

ئەحمەد وەک سێبەرەکەی خۆی لەنێوان کەلاوەکاندا هەڵکورمابوو، بەردەوام ئەو پرسیارەی لە خۆی دەکردەوە:

«چۆن کرا شتێکی ئاوا بقەومێ؟ هێزەکانی سەددام لەسەر چ بناغەیەک ئەو کارەیان کرد؟»

هیچ وەڵامێکی نەدەدۆزیەوە. هیچ هۆیەکی ماقووڵ بۆ کردنی تاوانێکی وەها گەورە لە ئارادا نەبووە. ئەو کەسە رزگاربووانەی ئەم پرسیاری

لێکردبوون وەڵامیان دابووەوە:
«سەددام شەیتانە. دەبێ چی باشی لێ چاوەڕوان بکرێت؟»
هەندێکی تر پێیان گوتبوو:
«چونکە ئێمە کوردین، بۆیە ئەو پیلانەی بۆ دارشتین. ئەو ڕقی لە ئێمەیە، ئەمە هۆیەکەیەو بڕایەوە«
هەندێکی تریش پێیان گوتبوو:
«چونکە ئێمە دژی ئەوین، بۆیە دەیەوێ لەناومان بەرێت، بەڵام ئەگەر ئەو بەم جۆرە مامەڵەمان لە گەڵدا بکات، چۆن دەکرێ ئێمە لە دژی نەوەستین؟»
لەوکاتەدا جەنگ لە دژی ئێران لە ئارادابوو. جەنگێکی درێژخایەن. ئەو جەنگە کاتێ دەستی پێکرد کەوا ئەحمەد هێشتا زۆر بچووک بوو. بۆیە هەتا ماوەیەکی زۆر ئەم وای دەزانی جەنگ شتێکی ئاساییە. ئەگەر دایک و باوکی باسی سەردەمی پێشانیان بۆ بکردبووایە، کە جەنگی تیا نەبووە، ئەم وەکو ئەفسانەو هەقایەت دەهاتە بەرچاوی. زۆر جار هەوڵی دەدا سالانی پێش لەدایک بوونی خۆی بێنێتە بەرچاو، ئەو ڕۆژگارەی کە دەنگ وباسی کوژرانی سەربازانی

تێدا بڵاو نەدەکرایەوە. هەڵبەتە نەیدەتوانی ئەمە بێنێتە پێش چاو لەهەمان کاتیشدا لە جەنگەکە نەدەگەیشت. ئەم لە عێراق ژیابوو، عێراق لە دژی ئێران پێشڕەوی جەنگی دەکرد. هەڵەبجەییەکان لەوڵاتی خۆیاندا دەچەوسانەوە. بەڵام ڕاستییەکەی ئەم لە هیچ لەو شتانە تێنەدەگەیشت، لەوکاتەدا چۆن بوو ئەم هەر وای وەرگرتبوو.

«ئەوەتا»

حەسەنی بچکۆڵە دەبوایە زۆر لەخۆی بکات تا دەنگی زۆر دەرنەچێ:

«ئەوەتا هات»

گەنجەکانی تریش تۆزی زیلەکە بەدی دەکەن. بە بێ ئارامی خۆیان بۆ ئامادە دەکەن. هەندێکیان هێندە بە حەماسەوە لە پشتی تاشە بەردەکانەوە لەسەر ئەژنۆ هەڵتووتاون وا دێنە بەر چاو وەک ئەوەی پێویست بکا تاشە بەردەکانی بۆ ڕابگرن. هەندێکی تریشیان، بەتایبەتی بچووکەکانیان بەدڵ پێیان خۆشە هەر ئێستا بەرەو ڕووی زیلەکە بڕۆن.

«بێدەنگ بن» جەبار بە هەڕەشەوە دەچرپێنێ:

«تکایە زۆر بێدەنگ بن، وا خەریکە هەموو شتێ

وەک پلانەکە بەڕێوە دەچێ، هاکا زیلەکەمان لێخوڕی. لەوانەیە زیلەکە بەتانیشی تێدا بێت»
ئەو بەچەشنێک قسە لەگەڵ گەنجەکان دەکا، وەک ئەوەی وشترێکی چەمووش دەستەمۆ بکات. حەسەنی بچکۆڵە کە لە خۆشییان دانەچۆقەی پێکەوتووە دەڵێ:
«لەوانەیە ئەمەی دەبێ ئێستا بیکەن، تەنیا یارییەک بێت ها؟»
گەنجەکانی تر بە حەماسەتەوە دەڕواننە دوور. ئەوان دەزانن ئەوەی روودەدا گاڵتە نییە.
ئەحمەد بە خێرایی دەڕوانێتە دواوە، سەیری ئەو تاشە بەردە دەکات کە ژن و منداڵەکان خۆیان لە پەنایەوە شاردۆتەوە. زۆربەیان چیتر ناتوانن بەپێ بڕۆن و ڕێگاکەش هێشتا زۆری ماوە بۆ سنووری تورکیا. جگە لەمەش هەتا بەرەو سەرەوەتر بۆ ناو شاخەکان بڕۆن دنیا ساردتر دەبێ. بەبێ خۆراک و بەتانی ئەو پیادەڕۆییە سەرناگرێ. زیلەکە لەهەموو شتێ گرنگترە، ئەگەر ئەوان ئەم زیلەیان دەست بکەوێ، کارەکە خێراتر دەبێ.
حەسەنی بچکۆڵە دەچرپێنێ:
«بەڵام بەهرە ئازایە»

ئەحمەد جارێکی تریش دەڕوانێتە بەهرە. کە هەرچەندە ماوەیەکیشە گوێی لە دەنگی زیلەکەیە. بەڵام وەک مردوویەک لەسەر ئەو ڕێگا شاخاوییە خۆی بە زەوییەکە داداوە. بەڕاستی بەهرە زۆر ئازابوو. کاتێ جەبار وتبووی واباشە کچۆڵەیەک لەسەر ئەو ڕێگایە خۆی بخاتە سەر زەوی، بەهرە یەکسەر خۆی هێنابووە پێشەوە. کچۆڵەیەک کەمتر گومانی لێدەکرێ. سەرەڕای ئەوە ڕەنگە سەربازەکان بەبینینی کچۆڵەیەک بیرێکی تەواو جیاوازیان بۆ بێ، کەوایان لێ بکات زیلەکە ڕابگرن.

ئەحمەد بە شلەژاوییەوە دەمانچەکەی بەر پشتێنی دەردێنێ. هەموویان چەکیان پێنادرێ، ئەوان خۆیان چەکیان کەم پێیە، ئەگەر یەکێک چەکێکی پێبدرێ ئەوە وەکو ئەوە وایە کە نیشانەی ئازایەتی لەلایەن جەبارەوە پێ بەخشرابێت. ئەحمەد دەیزانی کە ئەوە مانای وایە لەکاتی پێویستدا دەبێ ئەو چەکە بتەقێنێ و ئامانجەکە بپێکێ، لەپێشدا ئەوەی لەگەڵ خۆیدا بڕیبووەوە. بەبێ دەنگییش هیوای دەخواست کە شتی وا ڕوونەدات.

جەباریش شێنەیی و ئارامییەکەی پێشتری

نامێنێ، فیشەکدانەکەی کە بە پانی لەسەر سینگی بەستوویەتی دەسووڕێنێتەوەو دەمانچەکەی بەرزتر دەکاتەوە:

«ئاگادار بن!.. ئەوە مانای وایە ئێستاکە دەقەومێ»

ئەحمەد جارێکی تریش سەیرێکی بەهرە دەکاتەوە. ئێستاکە زیلەکە کەمێک نزیکتر بۆتەوە، بەڵام بەهرە خۆی لە گووره نابات. زیلەکە ناتوانێ خۆی لە بەهرە لابدات، چونکە لای چەپی ڕێگاکە خەرەندەو لای ڕاستیشی ڕەوەزە شاخێکە بەرەو ئاسمان هەڵکشاوە. زیلەکە یان دەبێ بوەستێ یان بەسەر کچۆڵەکە بکەوێ.

دەنگی هۆڕنێکی بەرز کش و ماتییەکە دەشکێنێ.
سەربازەکانی ناو زیلەکە بەهەرە بەدی دەکەن و لێخوڕینەکەیان هێواش دەکەنەوە. بەهەرە پەنجەیەکی خۆیشی ناجوولێنێ.
زیلەکە ڕۆیشتنەکەی هێواشتر دەکاتەوە، شوفێرەکە هۆڕنێکی قایمتری بۆ لێدەدا. حەسەنی بچکۆڵە لە ترسان پشووی سوار دەبێ، ئەحمەد هەست دەکا کە چۆن دەمی وشک دەبێ:
«باشە ئەی ئەگەر شوفێرەکە هێندە بێویژدان بێ وەک چۆن باسی بێویژدانیی سەددام دەکەن و پێ لە بەهەرە بنێ؟ یان هەست بە شتێک بکات و لەترسان ئیستۆپ نەگرێ؟»

زیلەکە کەمێکی تریش هێواش دەکاتەوە، بەڵام ناوەستێ، هەر بە دەنگی زل هۆڕن لێدەداو، هۆڕن لێ دەدا.
«بوەستە هەی دایک قەحبە« جەبار دەچرپێنێ
«دە بوەستە ئیتر!»
مستەفای ڕەقەڵە دەمرڕێنێ:

«ئەگەر نەوەستێ پێستەی لە لەشی دادەماڵم»
ئەحمەد بڕۆ شێوە سێگۆشەییەکانی مستەفای وا دێتە بەرچاو کە لە ڕق و تووڕەییان بە جۆرێک دێنەوەیەک وەک ئەوەی لە تەختی نێوچەوانی بەرزتر ببنەوە.
حەسەنی بچکۆڵە چیتر قسە ناکات، تا دێ دەنگی هەناسەسوارییەکەی بەرزتر دەبێتەوە.
«بێدەنگ بە!» ئەحمەد بە چرپەوە بە مستەفا دەڵێ:
«بێدەنگ ! ئەوان وەختە گوێیان لێ بێ»
لێرەوە حەسەن بێدەنگ دەبێ. نیگا پڕ لەبەزەییەکانیشی زیاتر ئاڕاستەی بەهرە دەکات. تەنها ماوەی چەند مەترێکی کەم لە نێوان کچۆڵەکەو تایە زلەکانی زیلەکەدا ماوە، بەلام بەهرە شێوەی ڕاکشانەکەی خۆی ناگۆڕێ. لەکاتێکدا دەم وچاوی هەردوو سەربازەکەی ناو زیلەکە دەناسرێنەوە.
سەربازەکان بە ئەسپایی، لەناو زیلەکەوە دیقەت دەدەن، وەک بڵێی ئاگاداری ئەوە بن، بەلام ئەوە نەزانن کە لەوانەیە خۆیان تووشی شتێک بکەن.
لەپشتەوەی دانەپۆشراوی زیلەکە، کۆمەڵێک

کارتۆن لەسەر یەک دانراون، دوو بەرمیل و سەندوقێکی گەورەش دەبینرێن.
«بوەستە« حەسەنی بچکۆڵە دەپارێتەوە:
«دە بوەستە ئیتر»
کاتێ دووسەربازەکەی ناوزیلەکە هەست بە وشەکانی حەسەن دەکەن، زیلەکە بەڕاستی لە دووری تەنها دوو مەترەوە لە بەهرە دەوەستێ. گەنجەکانی پشت تاشە بەردەکە هەناسەی خۆیان ڕادەگرن و جەباریش لوولەی دەمانچەکەی دەخاتە سەر قەراخی تاشە بەردەکە. هەڵبەتە هەردوو سەربازەکە بەیەکەوە دانابەزن، بەڵکو سەرەتا یەکێکیان دادەبەزێ، ئەم دەبێ ئەویان بپێکێ، بەر لەوەی بۆ ناو زیلەکە بگەڕێتەوە. ئەم دەبێ ئەوە بکات، یان ئەگەر بۆی بلوێ هەردووانیان بەیەکەوە بپێکێ.
بەڵێ هیچ یەکێ لە دەرگاکانی زیلەکە ناکرێنەوە، کەسیان زیلەکە جێناهێڵێن، تەنیا لەخوارەوە هەر هۆڕن لێدەدەن و هۆڕن لێدەدەن، بە دووربینەکانیان سەیر دەکەن و چەکەکانیان بە دەستەوە دەگرن.
مستەفای ڕەقەڵە لە تووڕەییان دەلەرزێ:
«هەی بێ مێشکینە، ئەگەر ئەو منداڵە لەهۆش

خۆی چووبێ یان مردبێ پێم نالێن چۆن دەتوانی گوێی لە دەنگتان بێ؟»
مستەفای ڕەقەڵە ئەو ڕۆژە هێندە ئەو قژەی لادابوو کە دەهاتەوە سەر نێوچەوانی، وەک ئەوەی هەموو تاڵە مووەکانی لە کاتی نیشانە گرتنەوەدا بێزاری بکەن.
سەرئەنجام سەربازی تەک شۆفێرەکە سەری لە پەنجەرەی زیلەکە دەردێنێ و بە گومانەوە لە خۆی دەڕوانێ:
«هێی لەگەڵ تۆمە« بە دەنگێکی نووساوەوە بەسەر بەهەرەدا هاوار دەکا:
«هەڵسەوە! ئێمە ئەو فیلانە دەزانین» پاشان سەربەرز دەکاتەوەو ڕووەو شاخەکان دەنەڕێنی:
«لیمانگەڕێن تێپەڕین، ئێمەش هەقمان بەسەرتانەوە نیە! تێگەیشتن؟»
جەبار بە دەنگێکی بەرز پێدەکەنێ، «ئەمانە نازانن»
ڕوو لە گەنجەکان دەکات و دەچرپێنێ: «ئەمانە تەنیا بەردەکان سەرەوگێڕ دەکەن تا بزانن چییان لەژێر دایە« ئینجا ڕوو بۆلای سەربازەکان وەردەگێڕێ و بەدەنگێکی نزم دەڵێ:
«چیتر کات بەفیڕۆ مەدەن، باشتر وایە ئێستا

هەردووانتان بێنە خوارەوە، ئیتر کارەکە تەواو دەبێ.»

جەباریش خەڵکی هەڵەبجەبوو، لەگەڵ کیمیاباران و کارەساتی شارەکەدا ژیابوو. دەوری چوار مانگێک دوای کارەساتەکە، سەری لە دێیەکەی مام عەبدول دابوو، لەوێ چی لە هەڵەبجە ڕووی دابوو هەمووی بە وردی گێڕابووەوە. ئەحمەد هەتا ئەوکاتە نەیتوانیبوو هیچ لەو بارەیەوە بدوێ، تەنها لە کێڵگەکە یارمەتی مام عەبدولی دەداو هیچ قسەیەکی نەدەکرد. مام عەبدول گەلێک جاران بەسەریدا دەیبۆلاند:

«تۆ شێت دەبیت، لاڵ دەبیت ئەگەر ئەو شتانە زیاتر لە دەروونتدا پەنگ بخۆنەوە»

کاتێ جەبار بیستبووی ئەحمەدیش خەڵکی هەڵەبجەیە، پرسیاری لێکردبوو ئینجا ئەحمەد توانیبووی لەوبارەیەوە قسە بکات.

جەبارو ئەحمەد دەبنە دوو برادەری راستەقینەی یەکتری. جەبار مامۆستایەکی گەنجی ڕیشپڕە، خاوەن ڕوخسارێکی بیرمەندانەیە. ئەحمەدیش گەنجێکی بێکەس و بێ خانەوادەیە. بەدرێژایی سێ ساڵان ئەمانە هەر باسی هەڵەبجەیان بۆ

یەکتری دەکرد، جێگاو ڕێگاکانیان بە بیر خۆیان دەهێنایەوە، تەنانەت ناسیاوە هاوبەشەکانیان بۆیەکتر ئاشکرا دەبوو. ئەو دووانە وەک بڵێی ببوونە وڵاتی دووەم بۆ یەکتری.

«تۆ لەجێگەی هەموو خوشک و براکانمی»

جارێکیان جەبار بە ئەحمەدی گوتبوو» کاتێ تۆ دەبینم هەڵەبجەم بیر دەکەوێتەوە« ئەمانە لەو سێ ساڵەدا بەردەوام خەونیان بەوەوە دەبینی کە ڕۆژێک بێت سەدام تۆڵەی لێبکرێتەوە. پاش هەموو ئاخاوتنێک جەبار دەیگوت:

«تەنیا چاوەڕێ بکە ئەحمەد گیان! ڕۆژێک دێت ئەو ئەهریمەنە نەگریسە دەتۆپێنرێ و ئێمەش سەربەخۆیی وەدەست دێنین، ژمارەیەکی یەکجار زۆر لە ئێمە لەڕێگای ئازادییەوە مردوون، هەر دە بێت رۆژێک ئازادی بەدەست بهێنین»

کاتێک عێراق کوێتی داگیر کرد و بەو هۆیەوە حاجی بۆش و ئەمریکا پەلاماری عێراقیان دا، خەڵکی هەموو شارولادێکان بە هیوای ئەوەبوون کە ڕۆژی سەربەخۆیی نزیک ببێتەوە. ڕاستییەکەشی کاتێ ئەمەریکاو هاوپەیمانەکان سەددامیان لە کوێت وەدەرناو زەبریان وەشاندە ئەفسەرانی سوپایەکەی سەددام،سەربازی

کوردیش لەناو ئەو سوپایەدا هەبوون. بەڵام زوو ڕیزەکانی سوپای سەددامیان بەجێهێشت. هەموویان دەیانگوت «بۆچی خۆیان بۆ چەوسێنەرێک بەکوشت بدەن؟ بۆچی یارمەتی خوێنڕێژێک بدەن؟» ئەو کوردانە لەشاخەکانەوە بۆ خزمەتی سەربازی ڕاپێچکرابوون تا لە جەنگدا ژیانی خۆیان بۆ سەددام بخەنە مەترسییەوە. ئیتر دەیانویست دژی سەددام خەبات بکەن. نزیکەی هەموو وایان دەویست، ئەحمەدیش وای دەویست. جەبار سەیرێکی ئەحمەدی کرد تا ڕای ئەو بزانێ، لێی پرسی:

«لەپێناوی هەڵەبجە ها؟»

ئەحمەد تەنیا سەری بۆ لەقاند:

«لەپێناوی هەڵەبجە!»

زۆری نەبرد، قارەمانانە، بەدڵێکی پڕ لەهیواوە ڕاپەڕین، کۆنە سروودەکەی کوردانیان کەوتەوە سەرلێو:

«کینە ئەم، ئەمن ئەم کوردن»

پیاوە بەهێزەکەی بەغدا لێیدرا. ئەمانیش دەیانویست ئەوەی ماوە تەواوی بکەن. لە باشوور شیعەکان دژی ئەو چەوسێنەرە ڕاپەڕین، لە باکور کوردەکان دەیانویست سەربەخۆیی

بەدەست بێنن.
بەڵام سەددام هێشتاکە زۆربەهێز بوو، سوپاکەشی هێشتا باشترین جۆری چەکی هەبوو. هەر تەنیا پاش چەندین شەڕی ناو کۆڵانان، کە زیانێکی ئەوتۆی پێنەگەیاندن، ئەحمەد بینی کە پیاوانی سەددام جارێکی تر بەسەرکەوتن و جارێکی تریش دەستی خۆیان بینیەوە، کوردەکانیش وەکو شیعەکان دەبووایە خۆیان ڕزگار بکەن، چونکە نەیان دەویست لە ناو تەڵەی تۆڵە لێکردنەوەیەکی ترسناکدا ببنە قوربانی. حاجی بۆش و هاوپەیمانەکانیشی تەنیا تەماشایان دەکردن. شەڕی کورد و شیعە شەڕی ئەوان نەبوو! ئەوان لە پێناوی نەوتەکە چوونە ناو کوێتەوە، نەوت بەلای ئەمریکییەکانەوە گرنگە، وەک جەبار هەموو جارێ بە تووڕەییەوە دەیگوت:
«کوردستان تەنیا مرۆڤی هەیە«
شوفێری زیلەکە لە پەنجەرەکەوە دەنەڕێنێ
«»خوادەزانێ ئێمە نامانەوێ خوێن برێژین»
جەبار لەبەر خۆی پێدەکەنێ:
« هەموو بەردەکانتان هەڵدایەوەو هیچتان نەدۆزیەوە، ئێستا خۆڵەکە بە پەنجە بپشکنن»

هیچ یەکێ لە گەنجەکان شتێک نالێت. حەسەنی بچکۆڵە خۆی لە ئەحمەد نزیک دەکاتەوە:
«زۆر هێواش بە»
ئەحمەد دەچرپێنێ و دەستی دەخاتە سەرشانی حەسەنی بچکۆڵە:
«زۆر هێواش بە! ڕەنگە ئەوەی خوارەوە درێژە بکێشێ، گەڕانەوەو بادانەوەی زیلەکە لەو ڕێگایە کارێکی ئەستەمە»
شوفێری زیلەکە جارێکی تریش هۆڕنێکی قایم لێدەدا، بۆ ماوەیەک دونیایەکە کش ومات دەبێتەوە.
«گیزەی میشێکیش نابیستری»حەسەن هەر بۆ ئەوەی شتێک بڵێ. بە چرپەوە بە ئەحمەد دەڵێ:
«ترسی ناوێ. یەکێکیان هەر دادەبەزێ» جەبار ورەی گەنجەکان بەرز دەکاتەوە:
«خۆ هەتا هەتایە ناتوانن چاوەڕێ بکەن. ناشتوانن پێ لە بەهرە بنێن. ئەگەر بیانتوانیبووایە، لەمێژبوو ئەوەیان دەکرد»
مستەفای ڕەقەڵە گەرمتر دەکۆکێ، بۆ سەتەمین جار تاڵە پرچەکانی سەر نێوچەوانی لادەدا. ئەمە بۆ ئەو زۆر درێژە دەکێشێ.
سەربازەکانی ناو زیلەکە یەکەو جگەرەیەک

دادەگیرسێنن، بەدەم جگەرە کێشانەوە لەگەڵ یەک دەکەونە ئاخاوتن. مەلێکی گەورە دادەبەزێتە ئاستی ئەوان، ئەحمەد بۆ ماوەیەک سەرنجی باڵەکانی دەدات:

«چەند ئاسان دەبوو ئەگەر...بەڵام چۆن؟» بۆ دەربازبوون تەنیا دوو ڕێگایان لەپێشە، یەکێکیان بەرەو تورکیا و ئەوەی تریان بۆ ئێران. هەردوو ڕێگاکەش بەناو شاخ و داخەکاندا، بەناو بەفرو سەرمادا تێپەڕ دەبن، برسێتیش وەک هاوڕێیەکی بەردەوام. کەواتە پێویستییان بەم زیلە هەیە، بۆ ئەمەش تاکو ژمارەیەکی زۆر لەخۆیان لەناو نەچن، بەلای کەمەوە دەبێ یەکێ لەو دووسەربازەی خوارەوە بکوژرێ.

مستەفای ڕەقەڵە دەڵێ:

«باشە بۆچی یەکسەر نایانپێکیت؟»

مستەفا کە چیتر ناتوانێ چاوەڕێ بکات «ئەوانە ئێستاکە خەریکی ئاخاوتنن، ئێستا تەواو لەناو نیشانەکەن بۆچی نایانپێکی؟»

جەبار بەژێر لێوەوە پێی دەڵێ:

«چییە؟ دەڵێی هەتاوەکە مێشکی وشک کردووی؟..من ناتوانم هەردووانیان لە یەک کاتدا بپێکم، ڕەنگە هەر کەسیان نەپێکم، پیشەی من

ماموستاییه، من نیشانشکێن نیم، باشه ئەوکاته چی دەڵێی ئەگەر بریندارەکه یان ئەوەی تریان یەکسەر سلفی لێداو پێی له بەهره نا؟»

مستەفا جارێکی تر بێدەنگ بووەوه، هەڵبەت ئەو نەیدەتوانی له قرچەی گەرمای ئەو نیوەڕۆیەدا. زیاتر دان به خۆیدا بگرێ. هەموو دەیانزانی مستەفا کوڕێکی زۆر ئازایه، بەڵام له دان بەخۆداگرتندا بێهێز بوو.

سەربازەکانی ناو زیلەکه بێدەنگ دەبن. جارێکیتریش سەربازی تەک شوفێرەکه سەری له پەنجەرەی زیلەکه دەردێنێ:

«دەی کیژۆڵه ئیتر بەسه! هەڵسەوه ئەگینا بەسەرت دەکەوین. کاتی ئەوەمان نییه سەرتاپای ڕۆژەکه لەسەرتۆ بوەستین»

بەهره خۆی له گووره نابات.

«بەڕاستی کچێکی ئازایه» جەبار دڵی خۆی خۆش دەکات «چەند ژیریشه!»

ڕووی بۆلای گەنجەکان وەردەگێڕێ:

«هەر ئێستا کارەکه تەواو دەبێ، ئەمه دوایین هەوڵیانه»

جەبار قسەکەی تەواو دەکات و ناکات، وشوفێرەکه بەشێوەیەکی کتوپڕ سلف لێدەدا

«دەی باشـە کیژۆڵـە»
لە پەنجەرەی زیلەکەوە هاوار دەکات:
«دیـارە تـۆ لـەوە زیاتـر شـتێکی تـرت ناوێـت، خـوات لەگـەڵ»
مستەفا بە ترسەوە هاوار لە جەبار دەکا:
«تەقـەی لێبکـەن! تەقـەی لێبکـەن بـەر لـەوەی کار لەکاربتـرازێ»
جەبار وەڵامی دەداتەوە:
«ئێسـتاکە دەبـێ تەقـەیـان لـێ بکرێـت، ئەگینـا مانـای وایـە خیانـەت لەخۆمـان دەکەیـن. بەڕاسـتی وا خـەریکـن بەسـەری دەکـەون».
لەسـەرخۆ، زۆر بەهێواشـی، تایـە زەبەلاحەکانـی زیلەکـە بۆسـەر بەهـرە دەخولێنـەوە.
«نا» حەسەنی بچکۆڵە بە هێواشی دەپاڕێتەوە:
«نەکەن!»
حەسـەنی بچکۆلە هێندە هەست بەمەترسـی دەکات بۆسـەر بەهـرە، لـە تـاوان فرمێسـک بـە ڕوخسـاریدا دێتـە خـوارەوە. لەوەتـەی بەیەکـەوە لـەم ڕەوەدا ڕادەکـەن، بەهـرە بۆ ئـەم وەک خوشـکێکی گەورەی وایە.
ئەحمـەد دڵـی هێنـدە بـە خێرایـی لێـدەدا وەختـە سـەری لەگـەڵ بسـووڕێ:

«بۆچی بەهرە هەر ئێستا خۆی قیت ناکاتەوە؟ کەس سوود لەوە نابینێت کە خۆی بخاتە ژێر زیلەکەوە »
لێرەوە جارێکی تر زیلەکە دەوەستێ. تایەکان تەنها چەند سەنتیمەترێک لەدووری بەهرەوە دەوەستن. جەبار بە دەنگێکی نزم دەڵێ
«من ئەمەم دەزانی».
ئەحمەدیش هەناسەی دێتەوە بەر. وەک بڵێی کەمێک سۆزی بۆ سەربازەکان جوولابێ دەڵێ:
« ئەوانە بکوژی بێ ویژدان نین، ئەگینا لەمێژ بوو پێیان لە بەهرەنابوو»
سەربازەکان جارێکی تریش لەگەڵ یەک دەکەونەوە ئاخاوتن، ئینجا کتوپڕ دەرگای لای نەفەری زیلەکە دەکرێتەوە. سەربازێکیان دێتە خوارەوە.

سەربازەکە بۆ ماوەیەکی کەم بە ئەسپایی گوێ قولاغ دەکا، ، ئینجا بە چەکەکەی دەستیەوە بۆلای بەهرە هەنگاو دەنێ.
ئەحمەد دەبینێ چۆن جەبار بە هەناسە بڕکێوە، نێوچەوانی گرژ دەکاتەوەو پەنجە بەدەمانچەکەیەوە دەنێ و دەیتەقێنێ. سەرنج

دەدا جەبـار وەختـێ تەقـە لەمرۆڤێـک دەکات، لـەوە ناچـێ تەقـە لـە نیشـانەیەکی مقەببا بـکات. دەشـیزانی دەبـێ جەبـار ئـەو کارە لـە ئەسـتۆ بگـرێ، چونکـە بـۆی نەبـوو ژیانـی بەهـرە بخاتـە مەترسـییەوە، هـەر یەکسـەر چەندیـن گولـلەی تریـش بـە سـەربازەکەوە دەنـێ، سـەربازەکە لەشـوێنی خـۆی بەردەبێتـەوە سـەر ڕێگاکـە.

تەقەکانـی جەبار دەبن بە ئاماژە بۆ هێرشکردن. ئەحمەدیـش وەک هەمـوو گەنجەکانـی تـر لـە گردەکـەوە بـاز دەداتـە خـوارەوە. لەوکاتـەدا ئەحمـەد سـەرنج دەدا چۆن هـەر لەگـەڵ یەکەمین تەقـەدا بەهـرە خێـرا بـە خشـکەیی دەخشـێت و خـۆی لـە پەنـا بەردێکـی گـەورە حەشـار دەدا. بەمـە هێرشـەکەیان بۆسـەر زیلەکـە ئاسـانتر دەبـێ، چونکـە ئـەو مەترسـییەی لێـی دەترسـان

ئیتر ڕووناادا.

مستەفا یەکەم کەسە دەگاتە لای زیلەکە، وەک چۆن بەڵێنی دابوو، یەکسەر دەرگای زیلەکە دەکاتەوەو بە دەمانچەکەی هەڕەشە لە شوفێرەکە دەکات:

«دابەزە، خێرا دابەزە» هاوار دەکات. مستەفا بە چەشنێک لە تەنیشت زیلەکە دەوەستێ کە ئەگەر شوفێرەکە بیەوێ تەقەی لێبکات ئەوا تەنیا بەر دەست و دەمانچەکەی دەکەوێ. بەڵام سەربازە شوفێرەکە لە پشت سووکانەکەوە هیچ بەرگرییەک لەخۆی ناکات، بەڵکو یەکسەر فەرمانەکەی جەبار جێبەجێ دەکات. سەربازەکە لەترسان و لەگەرمان ئارەقەی دەردەدا، بەڕەنگپەڕیوی، دێتە خوارەوەو لەپێش زیلەکە دەوەستێ، نیگاکانی لەسەر هاوڕێ کوژراوەکەی و ئەوگەنجانە ئاڵوگۆڕ دەکات، کە چوار دەوریان گرتووە.

بەهرە هاوار دەکات:

«بۆچی یەکسەر ئەو ئیبلیسە گەورەیە ناکوژن؟»

بەهرە لەپشت بەردەکە دێتە پێشەوەو ئەو ترسە لەخۆی دادەماڵێنێ کە بەدرێژایی ئەوکاتە بە توورەییەوە لێینیشتبوو. بە ڕقەوە

دەسکی دەمانچەکەی دەکێشێ بە سەربازە چوارشانەکەدا. ئەو دەمانچەیە جەبار دابووی بە بەهرە، تا لەکاتی پێویستدا ئەگەر لەگەڵ یەکەمین تەقە سەربازەکەی نەپێکا ئەوا ئەم بتوانێ بەرگری پێ لە خۆی بکات.
«نا» جەبار بە تکاوە بە بەهرە دەڵێ:
- «ئێمە لە زیلەکە زیاتر هیچی ترمان ناوێ»
- «بەڵام ئەو سەگە دەیویست پانم بکاتەوە»
بەهرە چەند جارێکی تریش دەسکی دەمانچەکە بە سەری سەربازەکەدا دەکێشێ. سەربازەکە بە ترسەوە ڕادەچڵەکێ.
پێش ئەوەی بەهرە بۆجاری سێیەم دەسکی دەمانچەکە بە سەربازەکەدا بکێشێ، ژنێک لەگەڵ منداڵەکانی لە گردەکەوە دێنە خوارەوە، ژنەکە باوەش بە بەهرەدا دەکات، هێواشی دەکاتەوەو دڵی دەداتەوە:
«بەڵام ئەو پێی لێ نەنای، ئەو لە کاتی خۆیدا زیلەکەی ڕاگرت»
سەربازەکە بەرگری لەخۆی دەکا:
«من هەرگیز پێم لەتۆ نەدەنا من خۆم دوو کچ و کوڕێکم هەیە، بەڵام من چیبکەم؟ ئیترئەوە

جەنگـە«
مستەفا دەقیڕێنێ:
«دەمـت بگـرە، هــەی گلاو! جەنگ..جەنگ..بەڵـێ ئـەوە جەنگـە بـەلام ئێـوە دژی ئێمـە دەجەنگـن! زۆر لەمێـژە ئـەو شــەڕە دەکـەن ، چەندیـن ســاڵە، خـۆ ئـەو شـەڕە هـەر تەنیـا هـی چەنـد هەفتەیـەک و دووان نییـە. ئێـوە دەتانـەوێ لەناومـان ببـەن و ئێمــەش بێدەنـگ بیـن، ئێـوە شــەیتانن، دەبـێ بـە زمـان هەڵواسـرێن تـا بۆگـەن دەبـن»
جەبار قسەکەی مستەفا دەبڕێ:
«بێدەنـگ! هێنـدە کاتمـان نییـە تـا بەفیـڕۆی بدەیـن».
جەبـار بەدەسـت و دەمانچەکـەی ئیشـارەت بـۆ ژن و منداڵـەکان دەکات سـواری زیلەکـە بـن، تـا لەپشــتەوە لەنێـوان کارتـۆن و بەرمیلـەکان یـان لەســەر ســەندووقەکە جێگـەی خۆیـان بکەنـەوە. کاتـێ هەمـوو ســەردەکەون، جارێکـی تریـش بـە دەسـت و دەمانچەکـەی ئیشـارەت دەکاتـەوە بـەلام ئـەم جارەیـان بـۆ سـەربازەکە.
سەربازەکە بە زەندەق چوونەوە هاوار دەکات:
« ئەوە چییە؟ دەتەوێ بمکوژیت؟»
جەبار ئەمری پێدەکات

«جلەکانت داکەنە! ئێمە پێویستمان بە جل و بەرگ هەیە، ناو ئەو شاخانە ساردن» سەربازەکە بۆ چەند چاو ترووکانێک دوودڵ دەبێ، پاشان بەخێرایی جلەکانی دادەکەنێ. ئەحمەدیش جلەکانی دەبات و سەیری جلەکانی سەربازە کوژراوەکە ناکات. لاشەکەی خەڵتانی خوێن بووە، کەس نایەوێ کراس و پانتۆڵە خوێناوییەکەی لەبەر بکات، بۆیە واز لە جلەکانی ئەو دەهێنن. ئەحمەد جلەکانی سەربازەکە دەداتە ژنەکان و خۆیشی سواری زیلەکە دەبێ. کاتێ لای حەسەنی بچکۆڵە دادەنیشێ، سەیر دەکات حەسەن هێشتا هەر دەگری. بە ئەسپایی دەست دەکاتە ملی حەسەن، ئێستاکە هیچ شتێکی ئەوتۆی نییە حەزبکا پێی بڵێ.

جەبار زیلەکە لێدەخوڕێ، مستەفا لەپێشەوە لەتەکی دانیشتووە. حەسەنی بچکۆڵە جار جار لەپشتەوە لە جامی کابینەی زیلەکە دەدات و ئیشارەت بۆ جەبار و مستەفا دەکات. ئێستاکە ئەوان لە چاوی حەسەنەوە وەک دوو پاڵەوانن بۆ ئەم. ئەحمەد بۆ حەسەن ڕوون دەکاتەوە، کە ئەگەر جەبار سەربازەکەی نەپێکابووایە، لەوانەبوو بەهرەیان بکوشتبووایە. هەروەها

بۆی ڕوون دەکاتەوە کە ئەمان لەهەموو حاڵەتێکدا هەر پێویستیان بە زیلەکە دەبوو. حەسەن ئەوانەی هەموو دەزانی، بەڵام دەیویست جارێکیتریش بۆی ئیسپات بێتەوە. ئێستا حەسەن ئەوە بۆ هەموو ئەوانەی دەیانەوێ گوێی بۆ بگرن باس دەکاتەوە کە زیلەکە بووەتە فەریادڕەسی ئەوان. ئیتر کەس پێویستی بەوە نییە زیاتر بەپێ بڕوا، هەر هیچ نەبێ منداڵە ساواکان ئیتر لەبەر سەرما ڕەق نابنەوە. ژنەکان بەسەر ئیشارەتی سوپاس بۆ حەسەن دەکەن، وەک ئەوەی ئەمیش بەشێک بووبێ لەو قارەمانیەتییە. حەسەن شانازی بەمەوە دەکات.

ئەحمەد هەر دەبێ بیر لەو دوو سەربازە بکاتەوە کە بەجێیان هێشتن. سەربازە شوفێرەکە ناتوانێ لاشەی هاوڕێکەی بباتەوە، دەبێ زۆر مەمنوون بێ ئەگەر بتوانێ بە پێ و تەنها بە جلەکانی ژێرەوەی بگاتە وێستگەی داهاتووی. ئەوە ئەگەر لەڕێگا تووشی کوردەکان نەبێ و بۆیان دەربکەوێ کە لەچی حاڵێکدا بووە، ڕەنگە جارێکی تریش بەگیر بێتەوە.

مستەفا پێی دەڵێت:

«تۆ زۆر بیر لەوانی تر دەکەیتەوە« مستەفای ڕەقەڵە دەیزانی ئەحمەد بیر لەچی دەکاتەوە «بیر لەخۆت بکەرەوە، تۆ هێشتا زۆرت لەپێشە ئەنجامی بدەیت ، ئێستا ئێمە دەبێ بڕوانینە ئایندە، نەک ئاوڕ بۆ ڕابردوو بدەینەوە«

ئەحمەد هەوڵی ئەوە دەدات. بەڵام ئەم مستەفا نیە، تا ڕق و کینەکەی یارمەتی بدات، هەروەها جەباریش نییە تا بزانێ حاڵەتی ناچاری چییە و کاری وەهای بۆ بکات کە دژی سروشتیش بێ. ئەم تەنیا ئەحمەدە کە خەم لەو دوو سەربازە دەخوات.

حەسەن بە چرپەوە بە ئەحمەد دەڵێ:

-»تۆ دەڵێی چی؟ دەبێ بتوانین بەو زیلە تا سنووری تورکیا بڕۆین؟»

-»بەڵێ بەو مەرجەی ئەگەر بەنزینەکە بەشی ئەوە بکات»

لەم کاتەدا پیرەژنێک بە پرتاوی ئاماژە بۆ ئاسمان دەکات و دەڵێ:

«ئا ئەوەتا» ئەحمەدیش یەکسەر سەیری ئاسمان دەکات و دەم و دەست قیت دەبێتەوە دەڵێ «کۆپتەرە!»

سێ دانە کۆپتەری جەنگی لە یەک کاتدا بە

تەنیشت یەکەوە دەردەکەون!
فڕۆکەوانەکان لەمێژە ئەوانیان کەشف کردووە...
«جەبار! جەبار!» بەهرە بەو پەڕی شڵەژاوییەوە دەکێشێ بە پەنجەرە بچووکەکەی پشتەوەی زیلەکە:
«بوەستە! دەبێ دابەزین.»
بەڵام زیلەکە ناوەستێ. جەبار وادەزانێ حەسەنی بچکۆڵەیە. بەهرە جارێکی تر لە پەنجەرەکە دەدات. ئەحمەد خێرا خۆی لەسەر لێواری زیلەکە دەچەمێنێتەوەو بە دەمانچەکەی لە پەنجەرەی لای راستی زیلەکە دەدا. مستەفا بە تووڕەیی جامی پەنجەرەکە دێنێتە خوارەوە سەر بۆ ئەحمەد بەرز دەکاتەوە:
- «ئەوە چییە؟ ئەگەر خۆتان پێ ڕاناگیرێ خۆ فڕێدەنە سەر جادەکە»
ئەحمەد دەڵێ:
-»کۆپتەرە..کۆپتەر»
بەڵام هەر ئەوکاتە جەبار تەیرێکی زەبەڵلاحی لەسەرووی سەری ئەحمەدەوە دێتە بەرچاو. بەهاوارەوە شتێک بە جەبار دەڵی و دەرگاکە دەکاتەوە و خۆ هەڵدەداتە سەر جادەکە، هەرچەندە زیلەکە بە ئاستەم خێرایی کەم

کردۆتەوە، ئەحمەدیش لەوە زیاتر ناوەستێ دەستی حەسەن دەگرێت و لەسەر لێواری زیلەکەوە خۆ هەڵدەدەنە خوارەوە تا قەراخی ڕێگاکە خلۆر دەبنەوە و زۆر خراپ بەر جادەکە دەکەون.
ئەحمەد یەکسەر حەسەنی گێژبوو لەو ترس و شڵەژانە کتوپڕییە ڕادەکێشێتە پشت چیمەنێکی نیمچە وشکهەڵاتووی نزیکیانەوە کە دەکەوێتە پشت هەڵدێرێکی بەردینەوە.
لەوکاتەدا زیلەکەش ڕادەوەستێ، ژن و منداڵەکانیش هەوڵ دەدەن خۆ ڕزگار بکەن بەڵام کاتەکە درەنگە.
ئەحمەد دەبینێ سێ بۆمب لە کۆپتەرەکانەوە هەڵدەدرێنە خوارەوەو کۆپتەرەکان با دەدەنەوە، کتوپڕ هەموو شوێنێک گڕ دەگرێ، زیلەکە، چیمەنەکانی سەر جادەکە، چەند درەختێکی وشکی بەسەریەکدا چەماوە، هەموو ئاگر دەگرن.

«جەبـار» ئەحمـەد بانگی دەكات، بـەڵام كت و پڕ مستـەفا لـە تەنیشـتییەوە پەیدا دەبێ «خێرا ڕاكـە« مستـەفا بەسـەر ئەحمـەددا دەقیڕێنـێ «خێرابـە ڕاكـە خێرا.. ئێسـتا كۆپتەرەكان دەگەڕێنـەوە« ئەحمەد بە پشووسـواری بـەدوای مسـتەفادا بەسـەر شـاخەكە هەڵدەگـەڕێ بـێ ئـەوەی ئـاوڕی دواوە بدەنـەوە. حەسـەنی بچكۆڵـە هێشـتا بەتـەواوی نازانـێ چـی بەسـەردێ، ئەحمـەد دەسـتی گرتـووەو لەگـەڵ خـۆی ڕایدەكێشـێ، وەختێكیـش توانـای نامێنـێ مسـتەفا دەستی دەگرێ. ئەو سـێ كوڕە بەیەكەوە بەسـەر شـاخەكەدا هەڵدەگەڕێـن. گرنـگ نیـە بـۆ كوێ، گرنـگ ئەوەیـە دوور بكەونـەوە، تەنیـا دوور بكەونـەوە، دوور دوور.

ئەحمـەد نازانـێ چەنـد بـە پـێ ڕۆیشـتوون. وەك بـە بیـری دێتـەوە لەڕاددەبـەدەر ڕۆیشـتوون. ئـەم گەنجانـە پشـوو نـادەن هەتـا دەگەنـە كەلێنـە شـاخێكی وەهـا كـە بتوانـن خۆیـان لـە پشـتییەوە حەشـار بـدەن. ئێسـتا جادەكـە زۆر لەخـوارەوەی ئەمانـە، تـا ئێسـتاش زیلەكـە هەردەسـووتێ و دووكەڵـە بـۆن ناخۆشـەكەی گەیشـتۆتە ئاسـتی ئەمـان. مسـتەفا بـە هەناسـە سـوارییەوە دەڵـێ:

«بۆمبی فۆسفۆڕ بوون..ئەو بۆمبانە بۆمبی فۆسفۆڕ بوون»
پاشان کتوپڕ لەتووڕەیی و بێدەستەڵاتییان لە پرمەی گریان دەدات:
«ئەو خوێن ڕێژانە هەموویان ئیبلیسن، ئەوانە دەبێ هیچیان نەمێنن»
ئەحمەد تەنیا بیر لە جەبار دەکاتەوە:
«جەبار!»
هەڵبەتە ئەو برادەرە نەیتوانیوە لەکاتی خۆیدا لە زیلەکە دەربچێ. جا چۆن دەیتوانی لە کاتێکدا شتەکان ئەوها کتوپڕ
بەخێرایی ڕوویاندا، کەسێکیش لێرەو لەوێ نییە بینیبی چۆن توانیویەتی خۆی ڕزگار بکات.
حەسەنی بچکۆڵەش بەوپەڕی بێدەنگی لەبەر خۆیەوە دەگری. وەک ئەوەی دڵدانەوەکانی پێشووی هەمووی وەک هەڵخەڵەتاندن بووبن و ئێستا بۆی ئاشکرا بووبێ.
ئەحمەد ناگری. ئەو بەر لەسێ ساڵ لە هەڵەبجە نەیتوانیبوو بگری، ئێستاش ناگری.
مستەفا دەیەوێ بزانێ، لێی دەپرسێ:
«دەمانچەکەت هەر لایە؟»
ئەحمەد تەنیا سەر ڕادەوەشێنێ.

«سوپاس بۆ خوا»
هێندە بە توندی تفێک فڕێ دەدا، وەک ئەوەی بیەوێ هەموو تووڕەییەکانی خۆی دەرهاوێژێ.
«من دەمانچەکەی خۆمم لەسەر دەشبوردی زیلەکە دانابوو، پێڕانەگەیشتم بیخەمەوە بەر پشتم، چونکە لەوانەبوو منیش بسووتابوومایە« سووتان! ئەم وشەیە جارێکی تر ئەحمەد دەگەڕێنێتەوە سەر ئەو حاڵەتەی کاتی خۆی لە هەڵەبجە هەستی پێکردبوو»هەست بە ساردییەک دەکات، وەک ئەوەی لە جیاتی خوێن ئاو بە دەمارەکانیدا بگوزەرێن.
مستەفا بە ئەحمەد دەڵێ:
«باشتر نییە من بیبەم؟ هیچ نەبێ من چەندساڵێک لە تۆ گەورەترم»
مستەفا بە ئەسپایی ئەمە دەڵێ و مەبەستی لە دەمانچەکەیە.
ئەحمەد یەکسەر دەست لەسەر گیرفانی شەرواڵەکەیدا دەنێ. هەرگیز ئەو دەمانچەیە ناداتە کەس، ئەو دەمانچەیە لە ئێستاوە بۆ ئەم وەکو سەر و قاچی، وەکو دڵی وایە.
شەوان ئەو شاخانە سارد دەبن، ئەو سێ لاوە خۆ دەدەنە پاڵ یەکتری تا گەرمیان بێتەوە،

حەسەنی بچکۆڵە دەخەنە ناوەڕستی خۆیانەوە، تا زۆرتر گەرمی بەربکەوێ. تا تاریک دادێت دەبێ لەو شاخ و داخانەدا بەپێ بڕۆن، هیچ شوێنێکی دیاری کراویشیان نیە، تەنها دەیانەوێ خۆ لەبەرچاوان بزربکەن.

« حەسەنی بچکۆڵە بە چرپەوە دەڵێ:

«ئەگەر جەبار سەربازەکەی نەکوشتبووایە «لەوانەبوو ئەوەیان لەگەڵ ئێمە نەکردبووایە«

ئەحمەد نایەوێ لەوبارەیەوە شتێک بڵێ. مستەفاش هەتا تێپەڕینی کاتێکی زۆر وەڵام ناداتەوە:

«بچکۆڵ! ئەمان هەر ئەوەیان لەگەڵ دەکردین» بە تاڵاوەوە دەیڵێ «بەم چەشنە یان بە چەشنێکی تر»

-»جا بۆچی؟»

حەسەنی بچکۆڵە دەیەوێ بزانێ:

- « بۆچی هەروا لەگەڵ ئێمە دەکەنەوە؟»

ئەمە هەمان ئەو پرسیارە بوو کاتی خۆی ئەحمەد لە هەڵەبجە دەیپرسی.

بەدەنگێکی نزم لەجیاتی مستەفا وەڵام دەداتەوە:

«چونکە ئێمە کوردین، تەنها لەبەر ئەوەی کوردین و سەربەخۆیی خۆمان دەوێ» جەبار

ئـاوا وەڵامـی حەسـەنی دەداتـەوە ئـەوەش ڕاستییەکەبوو.

لەگـەڵ تاریـک و ڕوونـی بەیانـی، بەبـێ خـەو، بـە برسـێتی، بەغـەم و پەژارەیەکـی زۆر، دەسـت بـە ڕۆیشـتن دەکەنـەوە. ئەحمـەد وای بـۆ دەچـێ وەک ئـەوەی ئیتـر ڕاکردنەکەیـان هیـچ مانایەکـی تـری نەمابـێ. ئـەی دەیانـەوێ بەپییـان و بەبـێ خـواردن بۆکوێ بڕۆن؟ خۆ ناتوانن تـا سنووری تورکیـا بـڕۆن، کەواتـە ئێسـتا تەنیـا بۆیـان هەیـە دەسـتبەرداری خۆیـان ببـن و بمـرن.

ئـەوە مسـتەفایە لەپێشـیانەوە دەڕوات، مسـتەفا! کە پڕە لـە تووڕەیی و ڕق و کینـە، بـەردەوام پلانی تـازەی تۆڵەسـەندنەوە دادەڕێـژێ. ئـەو دەڵـێ لـە

ئێستاوە دەبێ پیاوکوژەکانی سەددام ڕاو بکات، لە ئێستاوە بەدرێژایی ژیانی. دەبێ لەسنووری تورکیاوە خۆی لە پاسەوانەکانی سنوور نزیک بکاتەوەو یەکە یەکە بیانکوژێ. «دەبێ زەلیل بکرێن، دەبێ بۆ ژیانیان بپاڕێنەوە، لەوە زیاتر باوەڕم بە هیچی تر نیە، چیتر وشەی بەزەیی لای من مانای نییە»

حەسەنی بچکۆڵە بە شێنەیی گوێ بۆ قسەکانی مستەفا دەگرێ. زۆر سەری بۆ دەلەقێنێ.

«بەڵێ، نابێ بەزەیی بەو ئیبلیسانەدا بهێنرێتەوە. زۆر شتێکی باشە کە مستەفا ئاوها بەهێزە«

لەنێو گەرمای ئەو نیوەڕۆیەدا کۆپتەرێک بەدی دەکەن. کۆپتەرەکە بە تێکشاکاوییەوە دەکەوێتە سەر زەوی. مستەفا یەکسەر تەماشای زەویی خوارەوەی شاخەکە دەکات، ئەحمەد و حەسەنیش لەگەڵ ئەم سەیری دەکەن.

حەسەن دەچرپێنێ

«لەوانەیە فڕۆکەوانەکە لە ناو کۆپتەرەکە شتێکی بۆ خواردن پێبێ «

لای ئەو برسێتی بەر لەهەموو شتێکەوە بوو.

-»پێناچێت هیچ شتێک لەو خواردنە مابێتەوە»

مستەفا دەچرپێنێ:

«سەیرکە! ڕەنگە ئەو کۆپتەرە خۆی بە لاپاڵی شاخێکدا کێشابێ و تێکشکابێ و کابینەکەی گڕی گرتبێ»

ئەحمەد دەڵێ:

«بەڵام لەوانەیە فڕۆکەوانەکە هێشتا زیندووبێ»

ئەحمەد هیوای ئەوە دەخوازێ.

مستەفا بە زەردەخەنەوە پێیان دەڵێ.

«دەڵێن چی بچین سەیری بکەین؟»

پێش ئەوەی ئەحمەد وەڵام بداتەوە، حەسەن جارێکی تریش بە هێواشی دەڵێ:

«هەڵبەتە ئەمە یەکێکە لەوانەی بۆمباکانی هەڵدایە خوارەوە«

بە دەم و چاوی شێوەی قێز لێبوونەوە نیشان دەدا.

مستەفا سەری دەلەقێنێ:

«لە هەموو حاڵەتێکدا ئەوە بۆمبی فڕێداوە ، جا بۆسەر ئێمەش نەبووبێ هەڵیداوەتە سەر خەڵکی تر» لێرەوە داوای دەمانچەکەی ئەحمەد دەکات.

-»دەمانچەکەت بۆ چییە؟»

-»لەوانەیە پێویستمان بێت تەقەی پێ بکەین»

ئەحمەد بۆ ماوەیەکی کورت بیر دەکاتەوە:

«تۆ وادەزانی من دەترسم؟»
پاش ئەو هەمووەی ڕوویدا دەبێ بۆچی ئیتر دەست لە تەقەکردن بپارێزێ؟
مستەفا سەیرێکی ئەحمەد دەکات و شانی هەڵدەتەکێنێ:
«دە باشە مادام دەمانچەکە سوار بکەو بیگرە بە دەستتەوە. ئەحمەد وا دەکات و بەرەو لای کۆپتەرەکە شۆڕ دەبنەوە. حەسەن لەدوورەوە دەمێنێتەوە، لە کاتی شەڕدا بچکۆڵەی ئاوەها دەبێتە مایەی بێزاری.
ئێستا کە هەر تەنها لە دووری چەند مەترێکەوەن لە کۆپتەرەکە، دەنگی ناڵەناڵێک دێتە بەرگوێیان. دەم و دەست بێدەنگ دەبن.
ئەحمەد بە هێواشییەوە دەچرپێنێ:
«ئەوە برینداریکە« جگە لەو ناڵە ناڵە هیچ دەنگێکی تر نابیستن. زەحمەتە بریندارێک خۆی لەگەڵ ئەواندا بخاتە شەڕەوە.
«کێ دەزانێ» مستەفا بە ئەسپاییەوە دەڵێ:
«کێ دەڵێ ئەمە فێڵێک نیە، لەوانەیە دوو یان سێ کەس لە کۆپتەرەکەدا بووبن»
«جا ئێستاکە چی بکەین؟»
مستەفا فرمان دەدات

«بـا چاوبگێڕیـن» و بـە سکەخشـێ دوور دەکەوێتـەوە.

تەنهـا تاقـە سـەربازێک دەبینـن. سـەربازەکە چەنـد مەترێـک لـە دووری کۆپتەرەکـەوە کەوتۆتـە سـەر پشـت و بـە دەسـتەکانی سـکی خـۆی دەپەسـتێ جار جارە بە دەنگێکی بـەرز دەناڵێنـێ. کۆپتەرەکـە بـە چەشـنێک تێکشـکاوەو ئاگـری تێبەربـووە، ناشـێ کەسـی دیکـەی بـە زیندوویـی لـێ رزگار بووبـێ. مسـەفا هەڵدەسـتێتەوەو بـە خـۆ چەماندنـەوە بـۆلای فڕۆکەوانەکـە دەچـێ. ئەحمەدیـش لـە دوایـەوە دەڕوات تـا بەجارێـک وەک کەسـێکی شـەپڕە لێدراو لەشـوێن خـۆی دەوەسـتێ. خوێـن لـە سـکی فڕۆکەوانەکـە دێتـە خـوارەوە و تەواویـش هۆشـی لەخۆیەتـی. بـە چاوێکـی شـێواوەوە سـەیرێکیان دەکات، بـەڵام وادیـارە نـە دەتوانـێ سـەرهەڵبڕێ نـە دەشـتوانێ هەڵسـێتەوە.

مسـتەفا زۆر نزیـک لـە فڕۆکەوانەکـە وەسـتاوە. بـە ڕقـەوە چـاوی تێدەبـڕێ. کاتـێ فڕۆکەوانەکـە سـەرلەنوێ لەبـەر ئێـش وئـازار دەناڵێنـێ، ئـەم ڕووی بۆلای کۆپتەرەکـە دەسووڕێنێ جارێکی تـر سـەیری فڕۆکەوانەکـە دەکاتـەوە. بـە فڕۆکەوانەکـە

دەڵێ:
«تۆ سەر بەوانەی کە زیلەکەیان بۆردومان کرد؟ ها؟»
فڕۆکەوانەکە کەمێک چاوی دەکاتەوەو دایدەخاتەوە، بەبێ ئەوەی وەڵام بداتەوە. مستەفا پێ لە کەلەکەی فڕۆکەوانەکە دەژەنێ، بەڵام فڕۆکەوانەکە هەر تەنیا ئاخ و ئۆف دەکات.
«وەڵام بدەرەوە هەی زۆڵ، ئێمە بەزەییمان بە تۆدا نایەتەوە، وەک چۆن ئێوە بەزەییتان بە ئێمەدا نایەتەوە«
فڕۆکەوانەکە جارێکی تر چاو دەکاتەوەو سەری شۆڕ دەکاتەوە.
مستەفا کەمێک بیر دەکاتەوە، ئینجا فرمان بە ئەحمەد دەدا:
- «بیکوژە، ئەوە شایستەی کوشتنە»
-»چی؟» ئەحمەد بە گومانەوە لە مستەفا رادەمێنێ.
-»تۆ خۆت وتت، دەیتەقێنی، دە کەواتە بیتەقێنە«
مستەفا دەنگی هەڵدەبڕێ:
- «یان دەمانچەکە بدە بە من، من تۆڵەی خەڵکەکانی خۆمان دەکەمەوە«
ئەحمەد تووشی دوودڵی دەبێ. کاتێ بەڵێنی

دابـوو تەقـە بـکات، هەرگیـز بیـری لـە پێکاندنـی بریندارێـک نەکردبـووەوە. ئـەو مەبەسـتی چوونـە شـەڕ بـوو، نـەک ئیعـدام کـردن. مسـەتەفا بەتەواوەتـی ئـەوە دەزانـێ. بـەڵام ئـەو پیـاوەی وا ئێسـتا بـە نیـگای پاڕانـەوە تێیاندەڕوانـێ، هیـچ ڕێگـری لـە خـۆی کـرد تـا بۆمبـەکان فـڕێ نەداتـە خـوارەوە؟ لەکاتێکـدا بـە تـەواوی لێـی ڕوون بـوو کـە زیلەکـە پـڕ لـە ژن و منداڵـە. ئـەی ئـەوەی بۆمبـی کیمیایـی بەسـەر هەڵەبجـەدا بەردایـەوە؟ هیـچ ڕێگـری لـە خـۆی کـرد تـا خێزانەکـەی ئـەم لەنـاو نەبـات؟ ئەحمـەد دەیتوانـی دەمانچەکـە بداتـە مسـتەفا، بـەڵام جیـاوازی چییـە لەنێـوان ئـەوەی خـۆی بیپێکـێ یـان دەمانچەکـە بداتـە مسـتەفا؟

-»دە بیکـوژە دەی!» مسـتەفا هـاوار دەکا، «تـۆ تەنهـا چاکەیەکـی لەگەڵـدا دەکـەی، ئـەو واش نەبـێ هـەر دەتۆپـێ»

ئەحمـەد هەناسـەیەکی قـووڵ هەڵدەکێشـێ و دەمانچەکـە ئاراسـتەی پشـتی سـەری سـەربازەکە دەکات. ئینجـا چاوەکانـی دادەخـات و پەنجـەی پێوەدەنـێ. لەبەرخۆیـەوە دەڵـێ لەپێنـاوی جەبـار، لـە پێنـاوی دایـک و بـاوک و خوشـک و براکانـی، لـە پێنـاوی هەمـوو هەڵەبجـە، لـە پێنـاوی هەمـوو گەلـی

کورد. گرمەی تەقەکە لەشاخەکانەوە دەنگ دەداتەوە، هەناسە کورتەکانی بەر لە تەقەکە ئەحمەد دێنێتەوە هۆش خۆی، بەترسەوە چاو دەکاتەوەو سەیری سەربازە کوژراوەکە دەکات کە وەک جاران لەوێ کەوتووە، تەنیا کەمێک سەری بەلادا شۆڕبۆتەوە و دەستەکانیشی لەسکی هاتوونەتە خوار.

«زۆر باشە« مستەفا بە دڵخۆشییەوە پێی دەڵێ «بەڵام من درۆم لەگەڵدا کردی: چونکە ئەو هەڵێکی بۆ ژیان هەبوو، لەوانەیە هاوڕێکانی لەمێژە بەدوایدا بگەڕێن»

ئەحمەد خۆیشی بیری لەمە دەکردەوە. ئەم سەربازەکەی کوشت، چونکە لەدوای هەموو ئەو شتانەی ڕوویاندا دەبووایە ئەمە بکات. بەڵام ئەم لەئێستاوە دەزانێ، جارێکی تر هەرگیز کاری وەها ناکات. ئەحمەد بە بێدەنگی دەمانچەکە دەداتە مستەفا.

مستەفا بە پێکەنینەوە لێی وەردەگرێ، وەک ئەوەی ئەمە شتێکی چاوەڕوانکراوبێ لەلای:

«ئەوە هێندە ئازاری دای خوێنڕێژێک ئیعدام بکەیت؟» سەری دەلەقێنێتەوە «هەر لەبەر ئەمە تۆ هەرگیز نابیت بە پێشمەرگە« (پێشمەرگە

ناوی خەباتکارانی کوردە، بەواتای ئەوانەی ڕووبەڕووی مەرگ دەبنەوە)

ئەحمەد هەرگیز نەیدەویست ببێتە پێشمەرگە. جەبار پێشمەرگە بوو، مستەفا پێشمەرگەیە. ئەحمەد هەر تەنیا پازدە ساڵە، ئەوا مرۆڤێکی کوشت. ئەم خەم لەوە ناخوا کە زۆر خراپتر لە خۆی قەوماوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا شانازی بەمەوە ناکات. تەقاندنی ئەو گوللەیە بەرەو کۆتایی چوون بوو، نەک بەرەو دەستپێکردنێکی تازە.

جارێکی تریش هەرسێ گەنجەکە تا ئێوارە دەست بەڕۆیشتن دەکەنەوە، جارێکی تریش شەوان لەپاڵ یەکتری لە کەلێنە شاخەکاندا دەخەون. هەڵبەتە چیتر قسە لەگەڵ یەکتری ناکەن. ئەحمەد کڕو بێدەنگ واز لە هەموو ئاخاوتنێک دێنێ.

بەڵام دەبێ باسی چی لەگەڵ یەکتری بکەن؟ باسی ئەو برسێتییەی هەناویان دەکۆڵێ؟ باسی ئەو غەم و پەژارەیەی ئازایەتییان لێ زەوت دەکات؟ باسی ئەو شانسە کەمەی بەزیندوویی مانەوەیان لەو ڕاکردنەدا؟ ئەوەی ڕوویدا، تازە ناگۆڕێ، باسکردنیشی باریان قورستر دەکات.

ئـەو هەمـوو خەڵکـەی لـەم چەنـد ڕۆژەی دواییـدا مـردن، بـۆ ئەمانیـش لەگەڵیانـدا نەمـردن؟ باشـتر نەبـوو ئەمانیش بەچارەنووسـی خۆیـان بگـەن؟

هەڵبەتـە ئـەو سـێ گەنجـە بەخـت یاوەریـان بـوو. ئێـوارەی ڕۆژی دوایـی دەگەنـە کاروانێـک لـە خەڵکـی ڕەوکـردوو کـە ئەوانیـش دەیانـەوێ بـەرەو سـنووری تورکیـا بـڕۆن. لەوانـەوە خـواردن و خواردنەوەیـان دەسـت دەکـەوێ و دەتوانـن لـە تەنیشـت ئـەو ئاگـرەش بخـەون کـە پیاوانـی کاروانەکـە بـۆ ژن و منداڵەکانیـان هەڵیانگیرساندبوو.

بەیانی رۆژی دواتر مستەفا باسی بۆردومانکردنی زیلەکەو ئیعدامکردنی فڕۆکەوانی کۆپتەرەکەیان بۆ دەکات. هەموو دەڵێن ئەحمەد کارێکی ڕاستی کردووە. بەڵام ئەحمەد هیچ قسەیەک ناکات. ئەو خۆی وای دێتە بەرچاو کە شایانی ئەو فریاکەوتنە نەبێت. ئایا دادپەروەرانەتر نەبوو ئەمانیش وەک ژن و منداڵەکانی ناو زیلەکە لەناوبچووبوونایە؟

ئەحمەدیش بەلای حەسەنی بچکۆلەوە پاڵەوانێکە وەک جەبار یان وەک مستەفا. زۆر بەشان و باڵی قارەمانێتییەکەی ئەحمەددا هەڵ دەدا. ئەحمەد زۆر دوورەپەرێز بە بێزاییەوە لەگەڵ خەڵکەکە دەڕوات. کاتێ دەگەنە سنووری تورکیاو لەوێوە ڕێگری چوونە ژوورەوەیان لێدەکرێ، ئەم وادەهاتە بەرچاو وەک ئەوەی دووراو دوور لە گەڵ ناڕەزایەتیی و تووڕەیی ژن وپیاوەکاندا بێ. ئەحمەد وەک هەموو ئەوانی دیکە، لە نێو سەرماوسۆڵەی شاخەکانی سەرسنوور سەرمای دەبێ، برسی دەبێ، مردنی منداڵە ساواکان دەبینێ. کاتێ خۆراکیش لە فڕۆکە ئەمریکییەکانەوە بۆ خەڵکەکە هەڵدەدرێتە

خـوارەوە، ئـەم لەسـەر وەرگرتنـی خۆراکەکـە لەگـەڵ خەڵکەکـە ناکەوێتـە شـەڕو ململانـێ. حەسـەنی بچکۆڵـە زەحمەتییەکـی زۆر دەبینـێ و دەکەوێتـە بـەر پاڵنانـی ژن و پیاوەکانـی تـرەوە تـا بتوانێ کەمێک خـۆراک بۆ خۆیـان دەسـت بخـات، ئەگـەر مسـتەفا نەبێ کـە نـاوە نـاوە شـتێکیان بـۆ پەیدا بکات، ئـەوا دەبێ هـەر بە برسـێتی بمێننەوە.

بەڵـێ ئەحمـەد نایـەوێ هیـچ بخـوات. هەمـوو جارێـک بەشـەکەی خـۆی دەداتـە حەسـەن. حەسـەنیش بـۆ ماوەیەکـی درێـژ لـەوێ دایدەنـێ، ئیتـر بـەر لـەوەی لێـی ببـەن دەیخـوات.

کاتـێ سـەرکردەکانی کـورد لەگـەڵ حکومـەت لـە بەغـدا کێشـەی گەڕاندنـەوەی خەڵکـە

ڕەوکردووەکەیان بۆ جێگاو ڕێگای خۆیان خستە ژێر تاووتوێکردن، حەسەن هێندە لاواز و بێتاقەت بوو بوو، کە دەبووایە حەسەن و مستەفا بەیەکەوە هەڵیگرن. مستەفا هەمیشە سەرکۆنەی دەکرد:
«هیچ ناخۆیت، هیچ ناڵێیت» مستەفا جار لە دوای جار دەیبۆلاند.»پێم بڵێ چی قەوماوە؟ تۆ خوێنڕێژێکی نیوە مردووت کوشتووە، کە ئەگەر ئەو بۆی ڕێککەوتبووایە تۆی دەکوشت. تۆ خەم لە خۆت دەخۆی یان لە مردووەکان؟»
ئەحمەد نە خەم لە خۆی نە لە مردووەکان ناخوات. ئەحمەد چیتر خەم ناخوات نە بۆ خێزانەکەی، نە بۆ جەبار نە بۆ ئەو خەڵکەی لەناو زیلەکە لەناو چوون. ئەم وای دەزانی کەوتۆتە ناو چاڵێکی زۆر قووڵ و زەبەڵلاح، بەچەشنێک کە ئیتر ناتوانێ لێی بێتە دەرەوە. ئەم پێی وابوو خواردن لەو چاڵەدا شتێکی ناماقووڵە. هەروەها ئاخاوتنیش هیچ مانای نیە.
مستەفا بەو نزیکانە وازی لێدەهێنێ، زۆریشی پێ سەیرە کەوا ئەحمەد هەتاکو ئێستاش هەر دەژی. بەلام حەسەن وازی لێناهێنێ. بەردەوام هەوڵ دەدا بیدوێنێ و بێدەنگییەکەی

بشکێنێ. حەسەن لەمەدا سەردەکەوێ، دوای ئەوەی ئەحمەد دەبینێ کەوا حەسەن زیاتر لە مستەفا ئاوڕی لێدەداتەوە و خەمی لێدەخوات. حەسەنیش کە وەکو ئەم کەس و کاری نەمابوو، پێویستی بە جەبارێک هەبوو نەک بە مستەفایەک. سەر ئەنجام ئەحمەد بەبێ ئەوەی حەزیش بکات داوا لە حەسەن دەکات شتێکی بداتێ بیخوا، ئەم هاوڕێ بچکۆڵەیەش هەرچی هەیەتی بە لە پێشی دادەنێ. دڵخۆش دەبێ بەوەی کە سەرئەنجام توانی شتێک بۆ ئەحمەد بکات.

**ڕوونکردنەوەیەک بە قەڵەمی نووسەر:**

ڕووداوەکانی ئەو چیرۆکە لە بەشی کوردستانی عێراقدا ڕوویانداوە. کوردستان ئەو وڵاتەیە هەرگیز دەوڵەتی فەرمی نەبووە. لە تورکیا ١٢ملیۆن و لە ئێران ٥ ملیۆن و لە عێڕاق ٤ ملیۆن و لە سووریا ملیۆنێک کورد دەژین. (ئەو ژمارانە هی سەرەتای نەوەتەکانی سەدەی ڕابردوون، کە ئەوکاتە بەم چەشنە تەخمین دەکران . بەڵام هەڵبەتە ئەو ژمارانە ئێستا زۆر

زیاتر بوونە لەم ولاتانە -و-) هەریەکە لەو ولاتانە بەشێکی کوردستانی داگیرکردووە. کورد کە یەکێکن لە کۆنترین نەتەوەکانی سەر ڕووی زەمین، وەک کەمینە بەو ولاتانەوە لکێنراون و دەچەوسێنرێنەوە.

کورد لەسەدەکانی ڕابردووەوە بەردەوام دژی چەوساندنەوە ڕاپەڕیون و ڕاپەڕینەکانیشیان هەر شکستی هێناوە. لەم سەدەیەی ئێستاماندا کورد لەعێراق بە دڕاندانەترین شێوە پەلامار دراوە. لەساڵی ١٩٦٨ -لەوساڵەی رژێمی بەعس هاتە سەر حوکم- هەتا سەرەتای ١٩٩١ بە تەنیا لەم ولاتەدا نزیکەی دووسەد هەزار کورد لەناو براون. خراپترین پەلامارێش بۆ سەر کوردەکانی عێراق لە ساڵی ١٩٨٨ ڕوویداوە. لەم ساڵەدا بە بیانووی ئەوەی کەوا زۆر لە کوردەکان پشتیوانی ئێرانی دوژمن بە عێراق دەکەن لە جەنگدا، سەددام حوسێنی دیکتاتۆر هەڵسا بە خاپوورکردنی پێنج هەزار گوند و شارۆچکەی کوردی و بەشی هەرە زۆری دانیشتوانەکانیشی لەناو برد. ئەوانی تریشی هەمووی بۆ باشووری عێراق گواستەوە.

لە ناوەڕاستی ١٩٩٠ عێراق ولاتی کوێتی لە

پێناوی نەوتە زۆرەکەی داگیر کرد. کوێت بچکۆڵە یە بەڵام وڵاتێکی کەنداوی زۆر دەوڵەمەندە بە نەوت. ئەو داگیرکردنە وای لە ئەمریکاو هاوپەیمانەکانی کرد لە مانگی کانوونی دووەم و شوباتی ١٩٩١ جەنگێک دژی عێراق بەرپا بکەن. دەبوایە زەبرێکی کوشندە لە سوپاکەی سەددام بدەن تا لە مانگی ئاداری١٩٩١ لە کوێت وەدەری بنێن. کوردەکانی عێراق هاتنە سەر ئەو باوەڕەی کە سەددامی دیکتاتۆر لەوشەڕەدا زۆر لاواز بووە، بۆیە هەڵێکی باشیان بۆ هاتۆتە پێشەوە تا پەلاماری بدەن. کوردەکان دژی دارو دەستەکەی ڕژێم ڕاپەڕین. شیعەکانیش کە پێکهاتەیەکی تری ڕاوەدوونراون لە خوارووی عێراق، لە هەمان کاتدا ڕاپەڕین. بەڵام دارو دەستەکەی سەددام هێشتا زۆر بەهێزتربوون لە حاڵی خراپی خەڵکە ڕاپەڕیوەکە، کە لەدەرەوە کۆمەک نەدەکران، بە پێچەوانەی پرۆسەی ئازادکردنی کوێت، وەک کێشەیەکی ناوەکی عێراق مامەڵە لەگەڵ ئەو ڕاپەڕینەکرا. جارێکی تریش کورد کەوتنەوە بەر هێرشی خوێناوی جەللادەکانی سەددام. تاکە ڕێگای ڕزگار بوونیش تەنیا ڕاکردن بوو بەرەو تورکیا یان ئێران. بەڵام ئەو ڕێگایە بەناو

سەرما و سۆڵەی شاخ و داخە سەختەکاندا دەڕۆیی. کاتێ حکومەتی تورکیا ڕێگری لە هاتنە ناوەوەی خەڵکە ڕاکردووەکە کرد، هەزاران کەس دەبووایە لەناو ئەو شاخ و داخانەدا بمێننەوە، نەیاندەویست بکەونەوە بەردەستی ڕاوەدوونەرێنەکانیان. ئیتر کارەساتێک دەستی پێکرد لەباس کردن نەدەهات. هەرچەندە زۆرلە وڵاتان ویستیان یارمەتییان بدەن، بەڵام خەڵکێکی بێ ژمار لە سەرمان، لە بێهێزییان، لە برسان مردن. پاش چەند هەفتەیەک لەم مەرگەساتە و لەژێر پاڵەپەستۆی وڵاتانی دونیا، ئینجا حکومەتی بەغدا هاتە سەر ئەوەی کێشەی گەڕاندنەوەی ئەو خەڵکە بۆ سەر جێگا و ڕێگای خۆیان لەگەڵ سەرکردە کوردەکان چارەسەر بکات، لەو میانەدا حکومەتی عیراق ئامادەیی خۆی نیشاندا تا باس لە چارەسەری کێشەی کەمینەی کورد بکا لەعێراق.

**کلاوس کۆردۆن-١٩٩١**

**کلاوس کۆردۆن** ڕۆماننووسێکی بەناوبانگی ئەڵمانییە، ساڵی ١٩٤٣ هاتۆتە دونیاوە. زۆر بایەخی بە ڕۆمان و چیرۆکی لاوان داوە، زۆر شتی بۆ منداڵانیش نووسیوە بۆیە لای نەوەی نوێی ئەڵمانی زۆر ناسراوە.

لەم چیرۆکەدا لە کۆمەڵێک منداڵ و لاوی هەڵەبجە دەدوێ، کە لە کۆڕەوەکەی ساڵی ١٩٩١دا تووشی چ دەردەسەرییەک دەبن و چەند قارەمانانە ڕووبەڕووی ئاستەنگەکان دەبنەوە.

کلاوس کۆردۆن لە ڕێگەی ئەم چیرۆکەوە ماهییەتی ئاشتیخوازانەی مرۆڤی کورد نیشان دەدات، ئەوە دەخاتە ڕوو کە مرۆڤی کورد هەرگیز شەڕخواز نەبووە بەڵکو لەپێناوی ژیانێکی سەربەرزانە لەسەر خاک و نیشتیمانی خۆی شەڕی بەسەردا سەپێندراوە.

- لە سەر ئەرکی بەڕێز **ئازاد تۆفیق** پارێزگاری هەڵەبجە چاپکراوە.